# شەرحی

# نُخْبَةُ الفِكَر فِي مُصطَلَح أَهْلِ الأَثَر

لە زانست و زاراوەکانی فەرموودەدا




دانانی

پێشەوا ئیبنو حەجەری عەسقەلانی

شەرح، ولێکدانەوەی

عەبدوڵڵا مەلا ئەحمەد، ئەحمەدئاوایی

# شەرحی

# «نُخْبَةُ الفِكَر في مُصطَلَح أهْلِ الأثَر»

## لە زانست و زاراوەکانی فەرموودەدا

دانراوی

پێشەوا ئیبنو حەجەری عەسقەلانی

شەرح ولێکدانەوەی

عەبدوڵڵا مەلا ئەحمەد، ئەحمەدئاوایی

یەکەم چاپ

2015

## پێناسی کتێب

*ناوی کتێب: شەرحی﴿نُخْبَةُ الفِكَر، فـي مُصطَلَح اَهْلِ الأَثر﴾
*بابەت: ئایینی – زانست و زاراوەکانی فەرموودە
* دانانی: پێشەوا ئیبن حەجەری عەسقەلانی، (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)
*ڕاڤیار: عەبدوڵلاّ مەلا ئەحمەد، ئەحمەدئاوایی
*پەیوەندیکردن: shexnami@yahoo.com
*نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم
*هەڵەچن: عەلی حاجی زەڵمی.
*چاپخانە: چاپخانەی چوارچرا _ سلێمانی.

ژمارەی سپاردنی (١٨٩)ی،ساڵی(٢٠٠٩)ی، پێدراوە.

## بسم الله الرحمن الرحيم

إنَ الحَمدَ لِلّهِ نَحْمَدُهُ وَ نَستَعَينُهُ وَنَستَغفِرُهُ، وَ نَعُوذُ باللهِ مِنْ شُرُورِ أنفُسِنا وَ مِنْ سَيِّئاتِ أَعْمالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضّلِلْ فَلا هادِيَ لَهُ، وَ أَشْهَدُ أَنْ لا إلهَ إلا الله وَحْدَهُ لا شَريكَ لَهُ، وَ أشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ) (آل عمران: ١٠٢)

(يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً) (النساء: ١)

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيماً) (الأحزاب: ٧٠ – ٧١).

أمّا بعد: فإن أصدق الحديث كتاب الله وخير الهدي هدي محمد ﷺ وشر الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار.

**پاشان:** بێگومان زانست بە تێکڕایی خاوەنی پێگە، و پیرۆزیی خۆیەتی، بەڵام لە نێوەندی پیرۆزیشدا پلەبەندی کاری خۆی دەکات، و زانست هەیە، مەزنترە، لەویتر، و پێوەخەریکبوونی پیرۆزترە، لە گشت کارێك، لە

نێو تێکڕای زانستەکاندا، مەزنترینیان زانستە شەرعییەکانن، ئەوانەی کە لە خزمەت توێژینەوەی قورئان، و سوننەتدان، پلەی هەرەبەرزی مەزنایەتیی و پیرۆزییان وەرگرتووە، و لەو نێوەندەشدا زانست و زاراوەکانی فەرموودە، ﴿فەرموودەناسی﴾، بووەتە چەپکەگوڵی دیار، و بەرزی ناو گوڵستانی زانستە ئیسلامییەکان، چونکە باشترین ڕێگایە بۆ پاراستنی سەرچاوەی دووەمی ئیسلامەتی، کە سوننەتە، لە خەوش و خاڵی لاوازی، و تەمومژی خورافات، و بێ ڕێزی، بێگومان سوننەت بە تەواوی جۆرەکانییەوە، ( فەرمایشتی، کرداری، تەقریری)، ڕووبەڕووی پێوەهەڵبەستن، و دەسکاریکردن، و بە لاڕێدا بردنێکی زۆر بۆتەوە، ئیتر یان لە لای دوژمنانەوە بووە، بۆ لاوازکردنی، یاخود لە لایەن دۆستە نەزانەکانییەوە بووە، بە نیازی بەهێزکردنی! وەك لە توێژینەوە وردەکاندا دەردەکەوێت، کە بە مەبەستی خزمەتیش سوننەت ڕووبەڕووی پێوەهەڵبەستن بۆتەوە، لێرەوە ئیتر کاری فەرموودەناسی گرنگی خۆیی دەسکەوت، و زانایانی فەرموودەناس هاتنە مەیدانەکە، و کۆمەڵێك ڕێ وشوێن و یاسایان دانا، بۆ پاراستنی سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، لە سەرجەمی ئەو گرفتانە، و دواجار بە زانستی﴿فەرموودەناسی﴾، ناوبانگی دەرکرد، و لەم سەروبەندەشدا، پێشەوای مەزن، ئیبنو حەجەری عەسقەلانی، (نخبة الفکر، فی مصطلح أهل الاثر)ـی، هێنایە بەرهەم، کە باشترین مەتن، و کتێبە، لە ڕووی کورتی، و پوختی، و ڕیزبەندی، و وردەکارییەوە! لەم بوارەدا.

لێرەوە دەبێت بزانین کە پێشەوای مەزن، ئیبنو حەجەری عەسقەلانی، لە ساڵی (٧٧٣)ـی، کۆچی، لە کەناری ڕوباری (نیل)دا، لە میسری کۆن هاتۆتە دنیاوە، و لە پێنج ساڵیدا دەستی کردووە، بە خوێندن، و لە نۆ ساڵیدا تەواوی قورئانی پیرۆزی لەبەر کردووە، و لە دوانزە ساڵیدا لە مەککەی پیرۆز بە ئیمامەت تەراویحی بۆ خەڵکی کردووە، و لە ماوەی خوێندنیشیدا لە خزمەت نزیکەی (٥٠٠) زانای مەزندا، چۆکی داداوە،و دەرسی خوێندووە، و لە تەمەنی (٢٣)، ساڵییەوە دەستی کردووە، بە کتێب دانان، و لە ژیانیدا نزیکەی (٢٨٢) کتێبی بە نرخی نووسیوە، و لە نزیکەی بیست مەدرەسەی ئایینی ناوداری زەمانی خۆیدا دەرسی وتۆتەوە، و نزیکەی یانزە ساڵ کاری قەزاوەتی کردووە، و نزیکەی (٣٠) ساڵ موفتی بووە، و دواجار لە ساڵی (٨٥٢)ـی، کۆچی دنیای بە جێهێشتووە، و وەفاتی کردووە، و سەبارەت بە (نخبة الفکر)یش، کە باشترین کورتە مەتنی زانستەکانی فەرموودەیە، نزیکەی نۆ شەرحی عەرەبی لە سەر نووسراوە، و لە لایەن (١٠) لە زانا بەرزەکانەوە بە شیعر هۆندراوەتەوە، و کراوەتە (منظومة)، و ئەو شیعرانەیش نزیکەی پێنج جار شەرح کراوون، و خودی مەتنی (نخبه الفکر)یش، چوار جار لە لایەن زانایانەوە کورت(مختصر) کراوەتەوە، و ئەو موختەصەرانەیش سێ جار لە لایەن زانایانەوە شەرح کراوون، و لێرەوە دەردەکەوێت کە (نخبة الفکر، في مصطلح أهل الاثر)، جێگای بایەخی تەواوی زانایان بووە، بە شەرحکردنی، و بە شیعرکردنی، و کورتکردنەوەی، و دیسان شەرحی ئەو

شیعرو موختەصەرانەیش، سەرەڕای ئەم شەرحەیش کە خوای پەروەردگار بۆ بەندەی گوناهباری ڕەخساند، کە لە خزمەت زانستەکانی فەرمووده‌دا بم، و بە زمانی کوردی شەرحی (نخبة الفكر، في مصطلح أهل الاثر)، بنووسم، و ئەو سەرچاوانەی خوارەوەیش بەردەست بوون، بۆ ئەم پەڕاوە ڕاڤەیەی (نخبة الفكر، في مصطلح أهل الاثر):


١.(تيسر مصطلح الحديث: زانستی زاراوەکانی فەرموودە)، نووسینی د. مەحموود الطحان، وەرگێڕانی: عەبدوڵلا مەلا ئەحمەد، چاپی (٢٠١٠).

٢.تدريب الراوی، للامام السيوطی، چاپی میسر، (٢٠٠٢).

٣.قواعد فی علوم الحديث، للامام التهانوی، چاپی بەیروت، (٢٠٠٧).

٤.المنهج الاسلامی فی الجرح والتعديل، د.فاروق حمادة، چاپی میسر، (٢٠٠٨).

٥.ڕێگەی ڕەهبەر، لە عیلمی ئوصولی حەدیسدا، نووسینی: مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، "گۆڕی پڕ نوور بێت"، چاپی یەکەم، بەغدا، (١٩٨٥).

٦.مقدمة ابن الصلاح، چاپی بەیروت، (٢٠٠٦).

٧.أبجديات فی مصطلح الحديث، نووسینی: مامۆستا مەلا سەعدی مەحموودی دەمەیەوی، چاپی ئێران (٢٠٠٨).

٨.شەرحی (نزهة النظر)ـی، ئیمام ئیبنو حەجەری عەسقەلانی، شەرحکردنی بە کوردی: عەبدوڵلا مەلا ئەحمەد، ( دەسنووس).

٩.النكت علی نزهة النظر، للشيخ علی بن حسن الحلبی الاثری، چاپی سعوديه، (١٩٩٢).

١٠.الباعث الحثيث، للامام ابن كثير، چاپی میسر، (٢٠٠٣).

١١.شەرحی (المنظومة البيقونية)، بە کوردی، نووسینی: عەبدوڵڵا مەلا ئەحمەد، چاپی سلێمانی (٢٠١٠).

١٢.فتح المغيث، للامام السخاوی، چاپی بەیروت، مێژووی چاپی لە سەر نییە!

١٣.زانست و زاراوەکانی فەرمووده، مامۆستا حەسەن پێنجوێنی، چاپی هەولێر(١٩٩٧).

١٤.شەرحی (أصول الحديث)، بە کوردی، نووسینی: ئیمامی بورکەوی، شەرح کردنی: عەبدوڵڵا مەلا ئەحمەد، ( دەستنووس).

١٥.شرح الفيه العراقی، للامام السيوطی، چاپی دیمەشق، (١٩٩٨).

١٦.لمحات من تأريخ السنة، و علوم الحديث، للشيخ عبدالفتاح أبو غدّة، چاپی بەیروت، (٢٠٠٨).

جا لە خوای مەزن داواکارم، کە ئەم شەرحە بکاتە سوودێك بۆ تامەزرۆیانی زانستی فەرموودە، و فەقێی کورد بە گشتی، و لە سەر کردەوەی چاکە بۆم بنووسێت، و بیکاتە مایەی خێری دنیا و دوارۆژمان، و ئیتر هەر بە تەمای دۆعای خێر ...........

وصلی الله علی سیدنا و نبینا محمد و علی آله و صحبه وسلم و الحمد لله رب العالمین

**خزمەتگوزاری زانستەکانی شەریعەت**

**باوکی نامی**

**عەبدوڵڵا مەلا ئەحمەد، ئەحمەدئاوایی**

**(١٣ی، صەفەری ١٤٣٣ هـ) - ( ٧ - ١ - ٢٠١٢)**

**سنە - ڕۆژهەڵاتی کوردستان**

## ﴿متن نخبة الفكر في مصطلح اهل الأثر﴾

(بسم الله الرحمن الرحيم)

الحمد لله الذي لم يزل عالما قديرا وصلى الله على سيدنا محمد الذي ارسله إلى الناس كافة بشيرا ونذيرا وعلى آل محمد وصحبه وسلم تسليما كثيرا.

اما بعد: فان التصانيف في اصطلاح أهل الحديث قد الغرماء وبسطت واختصرت فسألني بعض الإخوان ان الخص له المهم من ذلك فأجبته إلى سؤاله رجاء الاندراج في تلك المسالك فأقول الخبر الحديث إما أن يكون له طرق أسانيد بلا عدد معين أو مع حصر بما فوق الإثنين او بهما او بواحد فالأول المتواتر المفيد للعلم اليقيني بشروطه وهي عدد كثير أحالت العادة تواطؤهم على الكذاب رووا ذلك عن مثلهم من الابتداء إلى الانتهاء وكان مستند انتهائم الحسن وانضاف إلى ذلك أن يصحب خبرهم إفادة العلم لسامعه والثاني المشهور وهو المس تفيض على رأى ويطلق المشهور على ما اشتهر على الألسنة والثالث العزيز وليس شرطا للصحيح خلافا لمن زعمه والرابع الغريب وسوى الأول آحاد وفيها المقبول وهو ما يجب العمل به ثم الجمهور وفيها المردود لتوقف الاستدلال بها على البحث عن احوال رواتها دون الأول وقد يقع فيها ما يفيد العلم النظري بالقرائن على المختار كأن يخرج الخبر الشيخان في

صحيحهما أو يكون مشهورا وله طرق متباينة سالمة من ضعف الرواة والعلل أو يكون مسلسلا بالأئمة الحفاظ المتقنين حيث لا يكون غريبا ثم الغرابة إما ان تكون في أصل ا لسند طرفه الذي فيه الصحابي من أول التابعى اولا فالأول الفرد المطلق والثاني الفرد النسبي ويقل إطلاق الفردية عليه كما ان اكثر ما يطلقون الغريب على الفرد النسبي وخبر الآحاد بنقل عدل تام الضبط متصل معلل ولا شاذ هو الصحيح لذاته والمراد بالعدل من له ملكة تحمله على ملازمة التقوى والمروءة والمراد بالتقوى اجتناب الأعمال السيئة من شرك أو فسق أو بدعة والضبط ضبط صدر وهو أن يثبت ما سمعه بحيث يتمكن من استحضاره متى شاء وضبط كتاب وهو صيانته لديه منذ سمع فيه إلى ان يؤدى بالتام إشارة إلى المرتبة العليا في ذلك والمتصل ما سلم إسناده من سقوط فيه بحيث يكون كل من رجاله سمع ذلك المروى من شيخه والمعلل ما فيه علة خفية قادحة والشاذ ما يخالف فيه الراوى من هو ارجح منه وتتفاوت رتبه بسبب تفاوت هذه الأوصاف ومن ثم قدم صحيح البخاري ثم مسلم ثم شرطهما المراد به رواتهما مع باقي شروط الصحيح فان خف الضبط مع بقية الشروط لغيره فإن جمع كقول الترمذي حديث حسن صحيح فلتردد في الناقل حيث التفرد والإعتبار إسنادين وزيادة راويهما اي الصحيح والحسن مقبولة ما لم تقع منافية لرواية من هو أوثق فإن خولف بأرجح فالراجح المحفوظ ومقابلة الشاذ و إن وقعت المخالفة له مع الضعف فالراجح المعروف

ومقابلة المنكر والفرد النسبي إن وافقه غيره فهو المتابع والمتابعة مختصة بكونها من رواية ذلك الصحابي وإن وجد متن يروى من حديث صحابى آخر يشبهه فهو الشاهد وتتبع الطرق من الجوامع والمسانيد والأجزاء لذلك الحديث الذي يظن انه فرد هو الاعتبار ثم المقبول إن سلم من المعارضة فهو المحكم وإن عورض بمثله فان امكن الجمع بغير تعسف فهو مختلف الحديث وإن لم يمكن الجمع او ثبت المتأخر عرف بالتاريخ فهو محمود والآخر المنسوخ وإلا فالترجيح ثم التوقف ثم المردود إما ان يكون لسقط من إسناد او طعن في راو فالسقط إما أن يكون من مبادى السند من تصرف مصنف او من آخره بعدد التابعى ذلك فالأول المعلق قال ابن الصلاح إن وقع الحذف في كتاب التزمت صحته كالبخاري فما اتى فيه بالجزم دل على انه ثبت إسناده عنده وإنما حذف لغرض من الأغراض وما أتى فيه بغير الجزم ففيه مقال والثني والجواب والثالث إن كان باثنين فصاعدا مع التوالى فهو المعضل وإلا فالمنقطع ثم إن السقط من الإسناد قد يكون واضحا او خفيا فالأول يدرك بعدم التلاقي ومن ثم احتيج إلى التاريخ والثاني المدلس سمى بذلك لكون الراوى لم يسم من حدثه واوهم سماعه للحديث ممن لم يحدثه به ويرد بصيغته تحتمل وقوع اللقى كعن وقال فإن وقع بصيغة صريحة لا تجوز فيها كان كذبا وكذلك والجواب الخفي من معاصر لم يلق فالفرق بين المدلس والمرسل الخفى او التدليس يختص بمن روى عمن لقاؤه إياه فأما إن

عاصره، ولم يعرف انه لقيه فهو والجواب الخفى ثم الطعن إما ان يكون لكذب الراوى او تهمته بذلك او فحش غلطه او غفلته عن الإتقان او فسقه او وهمه بأن يروى على سبيل التوهم او مخالفته للثقات او جهالته او بدعته او سوء حفظه بأن يكون ليس غلطه اقل من إصابته فالأول الموضوع والثاني المتروك والثالث المنكر على رأي من لا يشترط في المنكر قيد المخالفة وكذا الرابع والخامس ثم الوهم إن يتحقق عليه بالقرائن وجمع الطرق فهو المعلل ثم المخالفة إن كانت في السياق سياق الإسناد فمدرج الإسناد او بدمج موقوف بمرفوع فمدرج المتن او بتقديم او تأخير في الأسماء كمرة بن كعب وكعب بن مرة فالمقلوب او بزيادة راو فالمزيد في متصل الأسانيد او بإبداله ولا مرجح فالمضطرب وقد يقع الإبدال عمدا امتحانا او بتغيير حروف مع بقاء صورة الخط في السياق فالمصحف في النقط والمحرف في الشكل ولا يجوز تعمد تغيير المتن بالنقص والمرادف إلا لعالم بما يحيل المعاني ومن ثم احتيج إلى شرح الغريب وبيان المشكل منها ثم الجهالة وسببها أن الراوى قد تكثر نعوته من اسم او كنية او لقب او حرفة الخ فيذكر بغير ما اشتهر به لغرض وصنفوا فيه الموضح وقد يكون مقلا فلا يكثر الأخذ عنه وصنفوا فيه الوحدان وهو من لم يرو إلا واحد أولا يسمى اختصارا و صنفوا فيه المبهمات ولا يقبل حديث المبهم ولو أبهم بلفظ التعديل على الأصح فان سمى وانفرد واحد عنه فمجهول العين او اثنان فصاعدا ولم يوثق فمجهول الحال وهو المستور ثم البدعة إما

بمكفر او بمفسق فالأول لا يقبل صاحبها الجمهور والتحقيق انه لا يرد كل مكفر ببدعته لأن كل طائفة تدعى ان مخالفيها مبتدعة وقد تبالغ فتكفر مخالفها فالمعتمد ان الذي ترد روايته من انكر اثرا متواترا من الشرع معلوما من الدين بالضرورة وكذا من اعتقد عكسه والثاني يقبل من لم يكن داعية إلى بدعته في الأصح إى إن روى ما يقوى بدعته فيرد على المختار وبه صرح الجوزجاني شيخ النسائي ثم سوء الحفظ إن كان لازما للراوى في جميع حالاته فالشاذ على راى او طارئا فالمختلط ومتى توبع السيء الحفظ بمعتبر كأن يكون فوقه او مثله لا دونه وكذا المستور والمرسل والمدلس صار حديثهم حسنا لا لذاته بل ب اعتبار المجموع من المتابع والمتابع ثم الإسناد وهو الطريق لموصلة إلى المتن والمتن هو غاية ما ينتهى إليه الإسناد من الكلام إما أن ينتهى إلى النبي صلى الله عليه وسلم تصريحا او حكما من قوله او فعله او تقريره أو إلى الصحابى كذلك وهو من لقى النبي صلى الله عليه وسلم مؤمنا به ومات على الإسلام ولو تخللت رده في الأصح لا خفاء في رجحان رتبة من لازمه صلى الله عليه وسلم وقاتل معه او قتل تحت رايته على من لم يلازمه أو لم، يحضر معه مشهدا أو على من كلمه يسيرا أو ماشاه قليلا أو رآه على بعد أو في حل الطفولية وإن كان شرف الصحبة حاصلا للجميع ومن ليس له منهم سماع منه فحديثه مرسل من حيث الرواية ويعرف كون الشخص صحابيا بالتواتر أو الاستفاضة أو الشهة أو باخبار بعض الصحابة أو بعض

ثقات التابعين او باخباره عن نفسه بأنه صحابى كذلك فالأول المرفوع والثاني الموقوف والثالث المقطوع ومن دون التابعى فيه مثله ويقال للأخيرين الأثر والمسند تزوجها صحابى بسند ظاهرة الاتصال فان قل عدده عدد رجال السند ، اما أن ينتهى إلى النبي صلى الله عليه وسلم او إلى إمام ذى صفة عليه كالحفظ والفقه والضبط والتصنيف كشعبة ومالك والشافعي والثوري والبخارى ومسلم ونحوهم فالأول العلو المطلق والثاني النسبى وفيه في العلو النسبي الموافقة وهي الوصول إلى شيخ احد المصنفين طريقه وفيه البدل و هو الوصول إلى شيخ شيخه كذلك وفيه المساواة وهي استواء عدم الإسناد من الراوى إلى آخره آخر الإسناد مع إسناد أحد المصنفين وفيه المصافحة وهي الإستواء مع تلميذ ذلك المصنف على الوجه المشروح في المساواة ويقابل العلو بأقسامه النزول فإن تشارك الراوى ومن روى عنه في السنن واللقى الأخذ عن المشايخ فهو رواية الأقران وإن روى كل منهما عن الآخر فهو المدبج وإن روى عمن دونه في السن أو في المقدار فالأكابر عن الأصاغر ومنه رواية الآباء عن الأبناء والصحابة عن عن تلميذه وفي عكسه كثرة ومنه من روى عن ابيه عن جده وإن اشترك اثنان عن شيخ وتقدم موت احدهما فهو السابق واللاحق وإن روى عن اثنين متفقى الاسم أو مع اسم الأب أو مع الجد أو مع النسبة ولم يتميزا فبإختصاصه بأحدهما يتبين المهمل وإن جحد الشيخ مروية جزما رد أو احتمالا قبل في الأصح وفيه من حدث ونسى وإن اتفق الرواة

في صيغ الأداء كسمعت فلانا قال سمعت فلانا الخ او غيرها من الحالات كسمعت فلانا يقول اشهد بالله لقد حدثنى فلان الخ فهو المسلسل وصيغ الأداء سمعت وحدثنى ثم اخبرني وقرات عليه ثم قرىء عليه وانا اسمع ثم انبأني ثم ناولنى ثم شافهنى ثم كتب إلى المشافهة والكتابة بالإجازة ثم عن ونحوها من الصيغ المحتملة للسماع والإجازة ولعدم السماع أيضا هذا مثل قال وذكر وروى فالأولان سمعت وحدثنى لمن سمع وحده من لفظ الشيخ فإن جمع فمع غيره وقد تكون النون للعظمة لكن بقلة، واولها أصرحها وارفعها مقدارا ما يقع في الإملاء والثالث أخبرني والرابع قرات لمن قرا بنفسه فإن جمع فهو كالخامس والإنباء بمعنى الإخبار إلا في عرف المتأخرين فهو للإجازة كعن وعنعنه المعاصر محمولة على السماع إلا من مدلس وقيل يشترط ثبوت لقائهما ولو مرة وهو المختار واطلقوا المشافهة في الإجازة المتلفظ بها و كذا المكاتبة في الإجازة المكتوب بها واشترطوا في صحة المناولة اقترانها بالإذن بالرواية وهي أرفع أنواع الإجازة وكذا اشترطوا الإذن في الوجادة والوصية بالكتاب وفي الإعلام أن يعلم الشيخ أحد الطلبة بأننى أروى الكتاب الفلانى عن فلان وإلا فلا عبرة بذلك كالإجازة العامة وللمجهول وللمعدوم على الأصح في جميع ذلك ثم الرواة إن اتفقت اسماؤهم واسماء آبائهم فصاعدا واختلفت أشخاصهم فهو المتفق والمفترق وإن اتفقت الأسماء خطا واختلفت الآباء نطقا مع اختلافهما خطا أو بالعكس كأن تختلف الأسماء نطقا وتأتلف خطا

وتتفق الآباء خطا ونطقا فهو المتشابه وكذا إن وقع ذلك الاتفاق في اسم الأب والاختلاف في النسبة وكذا إن وقع الاتفاق في الاسم واسم الأب والاختلاف في النسبة ويتركب منه ومما قبله أنواع منها أن يحصل الاتفاق والاشتباه إلا في حرف أو حرفين كمحمد بن سنان ومحمد بن سيار وعبد الله بن زيد وعبد الله بن يزيد أو الاتفاق في الخط والنطق لكن يحصل الاختلاف أو الاشتباه بالتقديم والتأخير أو نحو ذلك كالأسود بن يزيد ويزيد بن الأسود وأيوب بن سيار وأيوب بن يسار خاتمة ومن المهم معرفة طبقات الرواة الطبقة في اصطلاحهم عبارة عن جماعة اشتركوا في السن ولقاء المشايخ •وموالدهم ووفياتهم وبلدانهم واحوالهم تعديلا وتجريها وجهالة ومراتب الجرح وأسوؤها الوصف بأفعل كأكذب الناس ثم دجال أو وضاع أو كذاب وأسهلها لين أو سئ الحفظ أو فيه مقال ومراتب التعديل وارفعها الوصف بأفعل كأوثق الناس ثم ما تأكد بصفة أو صفتين كثقة ثقة أو ثقة حافظ وادناها ما أشعر بالقرب من أسهل التجريح كشيخ تقبل التزكية من عارف بأسبابها ولو من واحد على الأصح والجرح مقدم على التعديل إن صدر مبينا من عارف بأسبابه فإن خلا من تعديل قبل مجمل على المختارفصل و من المهم معرفة كنى المسمين المشورين بأسمائهم وأسماء المكنين ومن اسمه كنيته ومن اختلف في كنيته ومن الغرماء كناه أو نعوته ومن وافقت كنيته اسم ابيه كأبي إسحاق إبراهيم بن إسحاق أو بالعكس كإسحاق بن ابي إسحاق أو كنيته كنية زوجته كأبي أيوب وأم أيوب

ومن نسب ابيه او ما يسبق إلى الفهم كالحداد نسب إلى الحدادة لأنه كان يجالس الحدادين ومن اتفق اسمه واسم أبيه وجده أو اسمه واسم شيخه وشيخ شيخه ومن اتفق اسم شيخه والراوى عنه كالبخاري روى عن مسلم بن إبراهيم وروى عنه مسلم بن الحجاج ومعرفة الأسماء المجردة والمفردة التي لم يسم بها إلا واحد والكنى المجردة والألقاب والأنساب او تقع إلى القبائل وإلى الأوطان بلدا او ضياعا او سككا او مجاورة وإلى الصنائع والحرف ويقع فيها الاتفاق والاشتباه كالأسماء وقد تقع القابا كخالد بن محمد القطواني كان كوفيا ويلقب القطواني وكان يغضب منها ذلك ومعرفة الموالى من أعلى ومن اسفل بالرق او بالحلف او بالاسلام ومعرفة الأخوة والأخوات ومعرفة وضوء الشيخ والطالب وسن التحمل والأداء الأصح اعتبار سن التحمل بالتمييز وسن الأداء يقدر بالاحتياج والتأ هيل لذلك وكتابة الحديث وعرضه وسماعه وإسماعه والرحلة فيه وتصنيفه على المسانيد أو الأبواب او العلل فيذكر المتن وطرقه وبيان اختلاف نقلته او الأطراف فيذكر طرف الحديث الدال على بقيته ويجمع أسانيده إما مستوعبا وإما مقيدا بكتب مخصوصة ومعرفة سبب الحديث وقد صنف فيه بعض شيوخ القاضى ابي يعلى بن الفراء وصنفوا في غالب هذه الأنواع وهي نقل محض ظاهرة التعريف مستغنية عن التمثيل فلتراجع مبسوطاتها .

# «نُخْبَةُ الفِكَرْ في مُصْطَلَح أَهل الأثر»

**(بسم الله الرحمن الرحيم)**

**الحمد لله الذي لم يزل عليما قديرا وصلى الله على سيدنا محمد الذي ارسله إلى الناس كافة بشيرا ونذيرا وعلى آل محمد وصحبه وسلم تسليما كثيرا.**

**بە ناوی خوای گەورەو میهرەبان**

**سوپاس بۆ ئەو پەروەردگارەی کە بەردەوام زاناوتەوانایە، ودرود وسەلام لە سەر گەورەمان محەممەدﷺکە خودا ڕەوانەی کرد بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی ، تائەوان مزانی پیێ بدات بە بەهەشت، وبیّداریان کاتەوە لە سزای ئاگر، و سەلام ودرودی بیێ پایان لەسەرئال وبەیتی وهاوەلأنی بەرزو بەڕێزی!**

**أما بعد: فان التصانيف في اصطلاح أهل الحديث قد كثرت وبسطت واختصرت.**

**پاشان: بێگومان کتێب وپەڕتوك لە بواری زاراوەناسی زانستەکانی فەرمودە دا، لە کۆن وئێستادا زۆر وزەوەندبووە، وزۆریشیان درێژەیان پیێ دراوە تاحاڵی بوون لەسەریان تۆکمە تر بێت، وبرِێکیشیان لە بەرئاسانکاری کورت کراونەتەوە!**

**فسألني بعض الإخوان ان ألخص له المهم من ذلك فأجبته إلى سؤاله رجاء الاندراج في تلك المسالك.**

جاهەندێ لە برایان، لێمیان داوا کرد کە پوختەی بابەتە گرنگەکانی ئەم زانستە شمن وکەوێك بکەم، وبینوسمەوەو منیش بەگوێم کردن، بە هیوای قاڵ بونەوە لەم بوارەدا.

**فأقول: الخبر : إما أن يكون له طرق بلا عدد معين أو مع حصر بما فوق الإثنين أو بهما أو بواحد.**

بۆیە دەڵێم:( الخبر : فەرمودە)، یان ئەوەیە لە چەندەها ڕێگاوە دەگێڕدرێتەوە،یان لە چەند ڕێگایەکەوە ڕیوایەت دەکرێت، لەڕێی دوو کەس یان زیاتر یان یەك کەسەوە!

**١. فالأول: المتواتر المفيد للعلم اليقيني بشروطه .**

یەکەمیان:واتە: : ئەو فەرمودەیەی کە ژمارەیەکی زۆر بیگێڕنەوە، کە سودی ئەو زانستە دڵ دامەزرێنەرە یە( العلم الضروري،العلم اليقيني )ەیەی هەیە . کە پێویستە مرۆڤ بەتەواوی (جازما ) باوەڕی پێی هەبێت وەك ئەوەی کەشتەکەی بەچاوی خۆی ببینێ چۆن گومانی نی یە لەڕاستی یەکەی دا، بەڵام دەبێت ئەو مەرجانەی کە بۆی دانراون تیایدا هاتبنە دی.

## فەرمودەی موتەواتیر

**١.پێناسەکەی :**

**أ.لە ڕووی زمانەوە : ئیسمی فاعیلەو لە ( التواتر ) ەوە وەرگیراوە ، کە بەمانای یەك لەدوای یەك و هاوڕێك ( التتابع ) دێت ، جا کە دەڵێیت : ( تواتر المطر ) باران باری ، واتە یەك لە دوای یەك دەباری .**

**ب.لە ڕووی زاراوەوە : ئەو فەرمودەیەیە کە ژمارەیەکی زۆر بیگێڕنەوە، کە شتەکی عادەتی نەبێت ،کە ئەوانە لەسەر درۆ ڕێك بکەون . واتای پێناسەکە : واتە ئەو فەرمودەیە (الحديث ، الخبر ) ە یە ، کە لە هەموو ئاستێك لە ئاستەکان ( الطبقة ) ی سەنەدەکەدا بیگێڕنەوە ، چەند ڕاوی یەکی زۆر ، کە بە گوێرەی عادەت عەقڵ دانی پیادا نەنێت ، کە ئەوڕاوییانە کۆبووبنەوە ، لەسەر شێواندنی ئەو فەرموودەیە.**

**٢.مەرجەکانی:لە ڕونکردنەوەی پێناسەکەوەدەردەکەوێت کە موتەواتیر بونی فەرمووده بەچوار مەرج نەبێت نایەتە دی کە ئەمانەن :**

**أ.دەبێ ژمارەیەکی زۆر بیگێڕنەوە وەلەسەر لایەنی کەمی ئەو ژمارە زۆرە ڕا جیایی هەیە . لەسەرچەند قسەیەك ، کە ڕای هەڵبژێرراو ئەوەیە کەدە کەسن**

**ب.دەبێت ئەو ژمارە زۆرە لەسەرجەم ئاستەکانی سەنەدەکەدا هەبن .**

**ج.دەبێت عادەتی نەبێت کەئەوانە لەسەر درۆ کۆ بنەوە**

**د.پێویستە ئەو فەرموودەیە یان ئەندامەکانی هەست کردن پشت گیری لێوەبکات . وەك ئەوەی کەبڵێین . بیستمان یان بینیمان یان بەری کەوتین**

( لمسنا )یان ... بەلاّم ئەگەر هەوالّەکەیان عەقلّ پشت گیری لێوە دەکرد وەك ئەوە کەبلّێی بۆ نمونە : دونیا داهاتووە . ( العالم حادث ) ئەوە لەم کاتەدا هەوالّی موتەواتیری پێ ناوترێ .

۳.حوکمەکەی:

فەرموودەی موتەواتیر سودی ئەو زانستە دلّ دامەزرێنەرە یە( العلم الضروري،العلم اليقيني )ەیەی هەیە . کە پێویستە مرۆڤ بەتەواوی ( جازما ) باوەڕی پێی هەبێت وەك ئەوەی کەشتەکەی بەچاوی خۆی ببینێ چۆن گومانی نىیە لەڕاستىیەکەی دا هەردەبێ بەم جۆرەش بێت لەفەرمودەی موتەواتیردا بۆیە فەرموودەی موتەواتیر هەمووی وەرگیراوە وە پێویست بەباس کردن لەسەر چۆنایەتی ڕاوىیەکانی ناکات .

٤.بەشەکانی :

فەرموودەی موتەواتیر دەبێتە دوو بەشەوە : کەئەوانیش گوتراو( لفظي ) و ( معنوي )ین

أ.موتەواتیری گوتراو ( لفظي ):ئەوەیە کە لەفزەکەی و ماناکەی هەردووکیان موتەواتیر بن وەك فەرموودەی ( من كذب علي متعمدا فليتبوا مقعده من النار )کە نزیکەی حەفتاو ئەوەندە لەهاوەلاّن ڕیوایەتیان کردووە واتە: هەرکەسێ بەئارەزووی خۆی بەدەممەوە درۆبکات باجێگای خۆی لەئاگری دۆزەخدا ئامادە بکات .

ب.موتەواتیری مەعنەوی : ئەوەیە کەماناکەی موتـــــــــەواتیر بێت نەك لەفزەکەی .

وەك فەرموودەكانی بەرزكردنەوەی دەست لەنوێژدا كەلە پێغەمبەرەوەﷺنزیكەی سەد فەرموودە هاتووە هەموو فەرموودەیەك لەوانە تیایدا هاتووە ، كە پێغەمبەر (ﷺ) لەنزاكردندا دەستەكانی بەرز كردۆتەوە ، بەلاَم لەچەندەها كات و شوێنی جیاوازدا . هەموو كات و شوێنێكیان ( قضية )یەكیان موتەواتیر نییە بەلاَم ئەو ئەندازە هاوبەشەی نێوانیان كەبەرزكردنەوەی دەستەكانە لە پاڕانەوەدا بەموتەواتیری هاتووە . بەگوێرەی كۆكردنەوەی ڕێگاكانی گێڕانەوە .

٥.بوونی فەرمودەی موتەواتیر :

فەرموودەی موتەواتیر ژمارەیەكی ناوەند هەن لەوانە فەرمودەی حەوزی ( كوثر )و فەرمودەی مەسح كردن لەسەر گۆرەوی( الخف )و فەرمودەی بەرز كردنەوەی دەستەكانی لەدوعادا و فەرمودەی ( نضر الله أمرأ ..... ) وهی تریش كە زۆرن ، بەلاَم ئەگەر سەیری ژمارەی فەرمودە (آحاد )ەكان بكەین ، دەبینین كە فەرمودەی موتەواتیر زۆر كەمن . بەگوێرەی ئەمان .

٦.بەناوبانگترین كتێبەكان تیایدا:

زانایان بایەخیان بەكۆكردنەوەی فەرمودە موتەواتیرەكان داوە . و لەكتێبی سەربەخۆدا دایان ناون ، تالەسەر قوتابی گەڕانەوە بۆیان ئاسان بێت لەو دانراوانە :

أ.( الأزهار المتناثرة في الأخبار المتواترة ) كە ئیمامی سیوطي دایناوە ، بەگوێرەی بابەكان ڕێكی خستووە .

**ب.( قطف الأزهار ) کە دیسانەوە هی ( سیوطی )یە .پوختەی کتێبی پێشووە .**

**ج.( نظم المتناثر من الحدیث المتواتر ) کە ( محمد )ی کوڕی ( جعفر ) ی ( الکتانی )داینـاوە .**

## ٢. والثاني المشهور وهو المستفيض على رأى.

دووەم: باسی فەرمودەی مەشهورە، کە لەسەر یەکێك لە ڕاکان هاوڕێکی (مستفیض)ـە.

فەرمودەی بەناوبانگ ( المشهور ):

١.پێناسەکەی :

أ.لەڕووی زمانەوە : ئیسمی مەفعولە لە ( شَهَرْتُ الأمر )ەوەیە کاتێ دەرم خست و ئاشکرام کرد وەبەمەش ناسراوە لەبەردەرکەوتنی .

ب.لەڕووی زاراوەوە:ئەوەیە کەلەسێ کەس زیاتر ڕیوایەتی بکەن . لەهەمور طه بەقەیەکدا بەجۆرێك کە نەگاتە پلەی موتەواتیر .

٢.نمونەی مەشهور :

فەرمودەی ( أن الله لايقبض العلم أنتزاعا ينتزعه ..) واتە : خوا زانست و زانیاری لەدڵەکاندا ناشواتەوە و بەداڕنین دایناڕنێ لەدڵ و دەروونی خەڵکیدا .........

٣.بڵاوەوە بوو ( المُستَفيض ):

أ.لەڕووی زمانەوە : ئیسمی فاعیلە و لە ( أستفاض )ەوە هاتووە لە ( فاض الماء )ئاوەکە، بڵاو بۆوە وەرگیراوە، وەبەمەش ناسراوە لەبەر بڵاو بونەوەی .

ب.لەڕووی زاراوەوە :ڕا جیایی هەیە لەسەر پێناسەکەی لەسەر سێ قسە کە ئەمانەن

١.( مستفيض )هاومانای مەشهورە .

٢.( مستفيض ) : تایبەت ترە لە ( مشهور )چونکە بەمەرج گیراوە لە ( مستفيض )،دا کە دوولایەنەکەی سەنەدەکەی یەکسان بن ، بەڵام ئەمە لەفەرمودەی ( مشهور )دا بەمەرج نەگیراوە .

٣.( مستفيض ): گشتی ترە لە ( مشهور )واتە پێچەوانەی قسەی دووەمە

٤.( مشهور ) لەغەیری زاراوەدا ( المشهور غير الأصطلاحي ) :

مەبەست پێی ئەوەیە کەلەسەر زوبان بڵاو بێت بەبێ مەرجی حیساب بۆ کراو جا ئەمانە دەگرێتەوە .

أ.ئەوەیە کەیەك سەنەدی هەیە .

ب.ئەوەیە کەلەسەنەدێ زیاتری هەبێت .

ج.ئەوەیە کەبەهیچ جۆرێ سەنەدی نەبێت .

١.جۆرەکانی فەرمودەی مەشهوری ( غير الأصطلاحي ):

جۆری زۆری هەیە ناسراوترینیان :

أ.ئەوەیە کە ( مەشهور ) بێت ، تەنها لەلای زانایانی فەرمودە : نمونەکەشی ئەم فەرمودەیەی ( أنس )ە .( أن رسول الله ( ﷺ ) قنت شهراً بعد الركوع يدعوا على رعل وذكوان) واتە: پێغەمبەر ( ﷺ ) بۆ ماوەی مانگێك لەدوای روکوع قنوتی دەخوێند کەتیایدا دوعای لەهەردوو عەشرەتی ( رعل ) و ( ذكوان )دەکرد .

ب.ئەوەی کە ( مشهور )ە : لەلای زانایانی فەرمودەو زانایان بەگشتیو خەڵکی : وەك ( المسلم من سلم المسلمون من لسانه ويده واته موسڵمان ئەوەیە کە موسڵمانان لە زوبان و دەستی پارێزراو بن .

ج.ئەوەی کە ( مشهور )ە ، لەلای شەرع زانان وەك : فەرمودەی ( أبغض الحلال إلى الله الطلاق )[1] بووغزێنراو ترین شتی حەڵاڵ و ڕەها لای خوا تەڵاق خواردنە .

د.ئەوەی کە مەشهورە لەلای زانایانی ( أصول ): وەك فەرمودەی ( رفع عن امتي الخطا والنسيان وما استكرهوا عليه ) واتە : لەسەر ئوممەتەکەم سزای کاری هەڵەو لەبیر چونەوەو زۆرلێکران هەڵگیراوە .

ه.ئەوەی کە مەشهورە لەلای زانایانی نـــەحوو : وەك فەرمودەی ( نعم العبد صهيب لو لم يخف الله لم يعصه )کە ئەصڵی نیيە ماناکەی:چاکترین بەندەصوهەیبە کە ئەگەر لەخواش نەترسایە تاوانی نەدەکرد .

و.ئەوەی کە مەشهورە لەناو عاممەی خەڵکدا :وەك فەرمودەی ( العجلة من الشيطان ) پەلەکردن لە شەیتانەوەیە .

٦.حوکمی فەرمودەی مەشهور :

فەرمودەی مەشهور ئیتر ( الأصطلاحي )بێت یان (غير الأصطلاحي )لەخودی خۆیدا بە ( صحیح – ساغ ) یان ( غير صحيح ) دانانرێ بەڵکو بەو جۆرەیە کە هەیانە ( صحيح )ە و هەیانە ( حسن )ەو هەیانە ( ضعيف )ە ، بەڵکو هەشیانە ( موضوع )ە . بەڵام ئەوە هەیە کە ئەگەر مەشهوری ( الأصطلاحي ) بە ( صحيح ) دەرچوو ئەوا تایبەتمەندی

و جوێ کەرەوەیەکی دەبێت . کە پێش فەرمودەی ( عزیز ) و ( غریب ) دەخرێت .

٧.بەناوبانگترین دانراوەکان لەفەرمودەی مەشهوردا :

مەبەست لەدانراوەکان لەفەرمودەی مەشهوردا ئەو فەرمودانەن کەلەسەر زوبان مەشهورن نەك مەشهوری ( الأصطلاحي ) لەو دانراوانە :

أ.( المقاصد الحسنة فيما اشتهر على الألسنة )،کە دانراوی ( الأمام السخاوي ) یە .

ب.( كشف الخفاء ومزيل الألباس فيمن أشتهر من الحديث على السنة الناس ) کەدانراوی ( الأمام العجلوني )یە .

ج.( تمييز الطيب من الخبيث فيما يدور على السنة الناس من الحديث ) کەدانراوی ( أبن البديع الشيباني )یە .

٣. **والثالث العزيز وليس شرطا للصحيح خلافا لمن زعمه.**

سێیەم: باسی فەرمودەی عەزیزە، وە نابێتە مەرجی صەحێحێتی ، بە پێچەوانەی ئەوانەی کە بانگەشەی ئەم قسەیەیان کردووە، وەك(أبو علی الجبائی) گەورە زانای موعتەزیلە!

فەرمودەی دەگمەن ( العزیز )

١.پێناسەکەی :

أ.لەڕووی زمانەوە : صیفەی موشەبەهەیە لە ( عَزَّ - یعِزّ ) بەکەسرە - وەرگیراوە ، واتە کەم و دەگمەن .یان لە ( عزَّ - یعَزَّ ) بە فەتحە واتە بەهێزو توند بووە وەبەوەش ناسراوە ، کەیان لەبەر کەمی و دەگمەنیەتی . یان لەبەر بەهێزی یەتی لەبەر ئەوەی کە لە ڕێگای ترەوە هاتووە .

ب.لەڕووی زاراوەوە:ئەوەیە کەڕاوییەکانی لەدووکەس کەمتر نەبن لەسەرجەم تەبەقەو ئاستەکانی سەنەدەکاندا .

٢.ڕونکردنەوەی پێناسەکە :

واتە لەهەر تەبەقەیەکدا لە تەبەقەکانی سەنەد لە دوکەس کەمتر نەبن . بەڵام ئەگەر لەهەندێ لەتەبەقەکانی سەنەدەکەدا لەسێ کەس زیاتر بوون ، ئەوە زیانی نییە بەمەرجێ ئەگەر لەتەنها تەبەقەیەکیشدا بێت دووکەس هەر بمێننەوە . چونکە کەمترین تەبەقە لە تەبەقەکانی سەنەد حیسابی بۆ دەکرێ . ئەم پێناسەیە بایەخدار ( راجح )ترینیانە . هەروەك ( حافظ أبن حجر )وای نوسیوە هەندێ لە زانایان دەڵێن فەرمودەی ( عزیز ) ئەوەیە

که دوکەس یان سێ کەس ڕیوایەتی بکەن ، وەلەهەندێ لە شێوازەکاندا لە فەرمودەی ( مشهور ) جیایان نەکردۆتەوە .

٣.نمونەی فەرمودەی ( عزيز ):

وەك ئەوەی ( بخاری و مسلم ) ڕیوایەتی دەکەن لەفەرمودەکەی ( أنس ) ەوە،وبوخاری لەفەرمودەکەی ( أبو هريرة )ەوە ڕیوایەتی دەکات کە پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمویەتی ( لايؤمن أحدكم حتى أكون أحب أليه من والده وولده والناس اجمعين) واتە ئیمانی کامڵ نابێ هیچ کەستان تامنی لەباوك و دایکیو منالەکانی و سەرجەم خەڵکی خۆشتر نەوێ وەك ( قتادة )و(عبدالعزيز بن صهيب )یش لە( أنس )ەوە ڕیوایەتیان کردووە، وەهەروەها ( شعبة )و ( سعيد ) لە ( قتادە )ەوە گێڕاویانەتەوە .و( اسماعيل بن علية ) و(عبدالوارث)یش لە ( عبدالعزيز )ەوە ڕیوایەتیان کردووە .وەڕیوایەتیشی کردووە لەسەرجەمیانەوە .

٤.بەناوبانگترین دانراوەکان تیایدا :

زانایان دانراوی تایبەتیان لەفەرموودەی ( عزيز )دا دانەناوە ، وادیارە کەئەمەش لەبەرکەمیو نەبونی سودی گرنگە لەو جۆرە دانراوانەدا .

٤. **والرابع الغريب وكلها ـ سوى الأول ـ آحاد، وفيها المقبول و المردود، لتوقف الاستدلال بها على البحث عن أحوال رواتها، دون الأول وقد يقع فيها ما يفيد العلم النظري بالقرائن على المختار .**

چوارەم: باسی فەرمودەی غەریبە، کە سەرجەمیان، جگە لەیەکەم کەموتەواتیر بوو، سەر بە باڵی فەرمودەی ئاحادن! وە هەیانە وەرگیراوە، وهەیانە بەرپەرچ دراوەتەوە! چونکەبەبەڵگە کردنی هەڵدەسپێرێ تا لێکۆڵینەوە لە ەر حاڵەتی گێرەرەوەکان دەکرێت، جگە لە موتەواتیر! وە سودی زانستی تیۆری دەگەیەنن،بە بوونی ئامـاژەکان. لەسەر ڕای هەڵبژێراو!

**فەرمودەی نامۆ ( غریب )**

**١.پێناسەکەی :**

**أ.لەڕووی زمانەوە : صیفەی موشەبیەهەیە . بەمانای تاکەوەبوو ( المنفرد ) دێت ، یان بەمانای دور لەدەورو بەری دێت .**

**ب.لەڕووی زاراوەوە :ئەوەیە کەتەنها ڕاویەك تاکرەوانە ڕیوایەتی بکات .**

**٢.ڕونکردنەوەی پێناسەکە :**

**واتە ئەو فەرمودەیەی کەتەنها کەسێك بەسەربەخۆیی دەیگێڕێتەوە ئیتر یان لەهەموو تەبەقەیەکدا لە تەبەقەکانی سەنەدەکەدا یان لەهەندێ لەتەبەقەکانی سەنەدەکەدا . هەرچەندە لەتەنها تەبەقەیەکیشدا بێت وەزیاتر لەکەسێك لە تەبەقەکانی تری سەنەدەکەدا زیان ناگەیەنێت چونکە لای کەمەکە حیسابە .**

٥. **ثم الغرابة : إما ان تكون في أصل ا لسند ، او لا فالأول: الفرد المطلق والثاني : الفرد النسبي ويقل إطلاق الفردية عليه .**

پاشان غەریب بوونی فەرمودە یان لە ئەصڵی سەنەدەکەدایە.واتە کەسێك بە تاکڕەوانە لەئەصڵی سەنەدەکەدا ڕیوایەتی بکات .یان نا........کە یەکەمیان:( الفرد المطلق) ودووەمیان:( الفرد النسبي) پێ دەوترێت.

٣.ناونانی دووەم بۆی :

زۆر لەزانایان ناوێکی تر بەسەر فەرمودەی ( غەریب )دا دادەنێن کە ئەویش ( الفرد )ە،بەو حوکمەی کەهاومانان هەرچەندە هەندێ لەزانایانیش جیاوازیان کردووە لە نێوانیاندا هەریەکەیان بەجۆرێکی سەربەخۆ داناوە بەڵام ( حافظ أبن حجر ) لەڕووی زمان و زاراوە بەهاومانایان دادەنێت ئەوەندە هەیە وتویەتی : لەلای ( أصطلاح ) ناسان جیاوازیان لەنێواندا کراوە لەڕووی زۆر وکەم بەکارهێنانیەوە . جا ( الفرد )زیاتر بۆ ( الفرد المطلق ) فەردی ( بێ ناوو ناتۆر ) بەکاردێت و ( الغريب ) زیاتر بۆ فەردی ناوو ناتۆردار ( الفرد النسبى ) بەکاردێت .

٤.بەشەکانی :

فەرمودەی غەریب بەگوێرەی جێگای تاك ڕەوی بونی دابەش دەکرێت بۆ دوو بەش کە ئەوانیش غەریبی بێ ناوو ناتۆر ( الغريب المطلق )و غەریبی ناووناتۆردار ( الغريب النسبي )یە .

أ.( الغريب المطلق )و یان ( الفرد المطلق ) :

١.پێناسەكەی :

ئەوەیە كەغەریب بوونەكەی لە ئەصڵی سەنەدەكەدایە.واتە كەكەسێك بە تاكڕەوانە لەئەصڵی سەنەدەكەدا ڕیوایەتی بكات .

٢.نمونەكەی :

وەك فەرمودەی ( أنما الأعمال بالنيات ) واتە بێگومان هەموو كارو كردەوەیەك بەنیەتە . كەتەنها عومەری كوڕی خەتاب ڕیوایەتی كردووە هەربەم شێوازەش ئەو تاكڕەوییە بەردەوامە تاكۆتایی سەنەدەكە وەلەو تاكانەوە چەند ڕاوییەكی تر دەیگێڕنەوە.

ب.( الغريب النسبي ) یان ( الفرد النسبي ) :

١.پێناسەكەی : ئەوەیە كەغەریب بونەكەی لەسەنەدەكەی دایە واتە لە ڕاوی یەك زیاتر لەسەنەدەكەیدا دەیگێڕێتەوە پاشان ڕاوییەكی ئەصڵی تاك ڕەوانە ڕیوایەتی بكات . لەو راویانە .

٢.نمونەی : وەك فەرمودەكەی ( مالك ) لە ( زهری )یەوە، لە ( أنس )ە وە ( رضي الله عنه ) أن النبي(ﷺ )دخل مكة على راسه المِغْفَر ) كەتەنها ( مالك )لە ( زهری )ڕیوایەتی كردووە .

٣.هۆی ناونانەكەی :

ئەم بەشە بە ( غريب النسبى )ناسراوە چونكە تاكەوە بونەكەی بەنیسبەت كەسێكی دیاری كراوەوە ڕویداوە .

٥.لە جۆرەکانی ( الغریب النسبی ):

لێرەدا چەند جۆرێك لەناموّیی ( الغرابة )و تاکڕەوی ( التفرد )هەیە کە بە ( الغریب النسبی )حیسابیان بۆ دەکرێت چونکە غەریب بوون تیایدا هەروا ڕەها ( مطلق )نیيە بەڵکو ئەو ( غرابة )ە بەنیسبەتی شتێکی دیاریکراوەوە، هاتۆتە دی وەئەوجۆرانەش ئەمانەن.

أ.تەنها متمانە پێ کراوێك ڕیوایەتی ئەو فەرمودەیەی کردبێت ، ( تفرد ثقة بروایة الحدیث )وەك ئەوەی کەدەڵێت : هیچ متمانە پێکراوێك ڕیوایەتی نەکردووە ، جگە لەفلان کەس .

ب.تەنها ڕاوییەکی دیاری کراو لەڕاوییەکی دیاری کراوی ترەوە ڕیوایەتی کردووە ، ( تفرد راو معین عن راو معین )وەك ئەوەی کەدەڵێن تەنها فلان کەس لەفلان کەسەوە ڕیوایەتی کردووە ، هەرچەندە لەچەند لایەکی تریشەوە ڕیوایەت کرابێت لەکەسانی ترەوە.

ج.تەنها خەڵکی شارێك یان ناوچەیەك ڕیوایەتی بکات ( تفرد ا هل بلد او اهل جهة )وەك ئەوەی کە دەڵێن ، تەنها خەڵکی مەککە یان خەڵکی شام ڕیوایەتیان کردووە .

د.تەنها خەڵکی شارێك یان لایەك ، لەخەڵکی شارێکی تر یان لایەکی تر ڕیوایەتیان کردووە . ( تفرد اهل بلد او جهة عن اهل بلد او جهة اخری )وەك ئەوانەی کە دەڵێن تەنها خەڵکی بەسرە لەخەڵکی مەدینە ڕیوایەتیان کردووە ، یان تەنها خەڵکی شام لەخەڵکی حیجاز ڕیوایەتیان کردووە.

٦.دابەش كردنێكى تر بۆى :

زانایان فەرمودەى ( غريب )یان لەڕووى نامۆیى ( سند ) و ( متن )یشەوە دابەش كردووە بۆ :

أ.غەریب بوونى ( متن ) و ( اسناد ):كەئەو فەرمودەیەیە كەتەنها ڕاوىیەك ڕیوایەتى ( مەتن ) ەكەى كردووە .

ب.غەریب بوونى ڕشتە(اسناد )نەك تێكست(متن) : وەك ئەو فەرمودەیەى كە كۆمەڵێك كەس مەتنەكەى لەهاوەڵان ڕیوایەت بكەن ، وەتەنها هاوەڵێكیش لەهاوەڵێكى ترەوە ڕیوایەتى بكات ( ترمذي )لەبارەیەوە دەڵێت : لەم ڕووە وە نامۆیە . ( غريب من هذا الوجه ) .

٧.جێگاو پێگە ( مظان )ى فەرمودەى ( غريب ) :

واتە ئەوجێگایانەى كەغونەى زۆرى لەم جۆرەى لىێیە .

أ.كتێبى ( مسند البزار ) .

ب.كتێبى ( المعجم الأوسط )دانراوى ( الأمام الطبراني ) .

٨.بەناوبانگترین دانراوەكان ( كتێب )تیایدا :

أ.( غرائب المالك ) دانراوى ( الأمام الدار قطني ) .

ب.( الأفراد )كە دیسانەوە دانراوى ( الأمام الدار قطني )یە .

ج.( السنن التي تفرد بكل سند منها أهل بلدة )كە دانراوى ( ابو داود السجستاني )یە.

٦. وخبر الآحاد بنقل عدل تام الضبط متصل السند غير معلل ولا شاذ هو الصحيح لذاته .وتتفاوت رتبه بتفاوت هذه الأوصاف. ومن ثم قدم صحيح البخاري ثم مسلم ثم شرطهما .

ئەوە فەرموودە ئاحادە ی کە ڕشتە ( سەنەدەکەی )پەیوەست بێت . بەوەی کە کەسێکی ڕاستاڵ ( عادل ) و گێڕانەوەی بیّ کەم و کوڕی ( ضابط ) لەکەسێکی تری وەکو خۆیەوە تاکۆتایی سەنەدەکە وابێت . بەبیّ بوونی ( شاذ )و ( علة )بوون تیایدا .ئەوە بە( الصحيح لذاته) ناودەبرێت!وە پلەی صەحیش بەگوێرەی گۆڕانکاری لەو صیفاتانەی گێڕەرەوەکاندا دەگۆڕێت. هەر لەبەر ئەم حاڵەتەیشە کە ەحیحی بوخاری پێش صەحیحی موسلیم خراوە.

فەرموودەی ساغ ( الصحيح ):

١.پێناسەکەی :

أ.لەڕووی زمانەوە:ساغ ( الصحيح )دژی نەخۆش( السقيم )ە. وەئەمە ڕاستییەکەی ، ( حقيقة )ەکەی بۆ لاشە بەکاردێت ، وەبەشێوەیەکی ( مجاز )ی بۆ فەرموودەو ماناکانی تر بەکاردێت .

ب.لەڕووی زاراوەوە : ئەوەیە کە ڕشتە ( سەنەدەکەی )پەیوەست بێت . بەوەی کە کەسێکی ڕاستاڵ ( عادل ) و گێڕانەوەی بیّ کەم و کوڕی ( ضابط ) لەکەسێکی تری وەکو خۆیەوە تاکۆتایی سەنەدەکە وابێت . بەبیّ بوونی ( شاذ )و ( علة )بوون تیایدا .

٢.ڕوونکردنەوەی پێناسەکە :

پێناسەکەی پێشوو چەند شتێك دەگرێتەوە کەهاتنەدی یان پێویستە تا فەرموودەکە بەساغ ( صحیح )دابنرێت . کەئەمانەن .

أ.ڕشتە پەیوەستی ( اتصال السند ) :کەماناکەی ئەوەیە کە هەموو ڕاوییەك لەو ڕاوییانە ئەو فەرموودەیەیان ڕاستەوخۆ لەسەروو خۆیانەوە هەرلەسەرەتای سەنەدەکەوە تا کۆتایی وەرگرتبێت .

ب.ڕاستاڵی گێڕەرەوەکان ( عدالة الرواة ):واتە هەموو ڕاوییەك لەو ڕاویانە بەکەسێکی مسوڵمان و تێگەیشتوو ( بالغ ) و عاقل وچاکەکار ( غیر فاسق )وبە ناپیاوی ( غیر مخروم المروءة )ناوزەد کرابێت .

ج.بەهێزی بیری گێڕەرەوە ( ضبط الرواة )واتە : هەموو ڕاوییەك لەو ڕاوییانە ( تام الضبط )بێت ئیتر ئەو ( ضبط )ە، هی سنگ بێت ، یا کتێب .

د.بێ ناوازەیی تیایدا ( عدم الشذوذ ) :واتە فەرموودەکە ( شاذ )نەبێت کە ( شاذ ) بوونیش لەگەڵ متمانە ( الثقة ) دا پێچەوانە دەبێتەوە بۆ کەسێ کەلەو بەمتمانەترە .

ه.بێ عیللەت بوون ( عدم العلة ): واتە نابێت فەرموودەکە ( معلول )بێت . ( علة )یش هۆکارێکی گرێیاوی ( غامض )ی شاراوە ( خفی )یە . کەلەصیحەتی فەرموودەکە کەم دەکاتەوە . لەگەڵ ئەوەدا کەوەك ڕوکەش سەلامەتی لێ چاوەڕێ دەکرێ .

٣.مەرجەکانی :

لە ڕونکردنەوەی پێناسەکەوە دەردەکەوێت . کەمەرجەکانی فەرمودەی صەحیح کەتا بەصەحیح دابنرێ پێنجن کە ئەمانەن:( ڕشتە پەیوەستی: اتصال السند ). ڕاستاڵی گێڕەرەوەکان ( عدالة الرواة ) بەهێزی بیری گێڕەرەوە ( ضبط الرواة ) . بێ عیللەتی ( عدم العلة ). ناوازە نەبوون ( عدم شذوذ ). جاهەر کات مەرجێك لەو پێنج مەرجانە نەبوو، ئیتر ئەو فەرمودەیە بە ( صحیح )دانانرێ.

٤.نمونەکەی :

ئەوەی ( بخاری)یە،لەکتێبی ( صحیح )ەکەیدا هێناویەتی ، دەڵێت ( حدثنا عبدالله بن یوسف قال اخبرنا مالك عن ابن شهاب عن محمد بن جبیر بن مطعم عن ابیه قال : سمعت رسول الله ( ﷺ ) قرأ في المغرب بالطور ) واتە : ( عبدالله )ی،کوڕی یوسف پێی ڕاگەیاندین وتی ( مالك )لە ( ابن شهاب ) وەئەویش لە ( محمد ) کوڕی (جبیر )ی کوڕی ( مطعم )ەوە، لەباوکیەوە هەواڵی داوینەتێ کە پێغەمبەر ( ﷺ ) لە نوێژی مەغریب دا سورەتی ( طور )ی، خوێندووە . ئەم فەرمودەیە صەحیحە چونکە .

أ.سەنەدەکەی پەیوەستە : چونکە هەموو ڕاویەك لەو ڕاویانە لەمامۆستاکەیەوە بیستویەتی بەلاَم ( عنعنة) بوونی (مالك)و ( ابن شهاب ) و ( ابن جبیر ) ئەوە لەسەر پەیوەست بوون( الأتصال ) حیساب دەکرێ، چونکە ئەوانە درۆزن ( مدلّس ) نین .

ب.ج: چونکە ڕاویەکانی ڕاستاڵ ( عادل )ن و، بیر تیژ ( ضابط )ن،

وە ئابەم شێوازەش لەلای زانایانی زانستی ( الجرح والتعديل )باس کراوە .
١.( عبدالله بن يوسف ):( ثقة متقن ) متمانە پێکراوو وردەکارە .
٢. ( مالك ابن أنس ): ( امام حافظ ) .
٣.( ابن شهاب الزهري ) : ( فقيه ، حافظ ، متفق على جلالته ، واتقانه ) .
٤.( محمد بن جبير ) ، ( ثقة ) .
٥.( جبير بن مطعم ) صەحابیيە .
د.وەهەروەها لەبەر ئەوەی کە ( شاذ )نیيە ، چونکە فەرمودەيەکی بەهێزتر لەخۆی پێچەوانەی نەبۆتەوە .
ه.وەچونکە هيچ ( علة )ێکيش لەعيللەتەکانی تيادانیيە .
٥.حوکمەکەی :
بە کۆڕايی( أجماع )ی زانايانی فەرمودە و ئەوانەی حيسابيان بۆ دەکرێ لەزانايانی ( الأصول ) و ( الفقه )پێويستە کاری پێ بکرێ وە بەڵگەيەکە لەبەڵگەشەرعیيەکان . بۆ موسڵمان نیيە ، کەکاری پێ نەکات .
٦.مەبەست لەو گوتەيەيان کە دەڵێت ( هذا حديث صحيح ) يان ( هذا حديث غير صحيح ):
أ.مەبەست لەم گوتەيەيان :( هذا حديث صحيح ) ئەوەيە کە ئەو پێنج مەرجەی کەڕابورد تيايدا هاتووەتەدی . نەك ئەوەی کەلە خودی خۆيدا ( نفس الأمر )ەکەی صەحيحە . لەبەر دروست بوونی هەڵە ( الخطأ )و لەبيرچوونەوە ( النسيان ) تەنانەت لەکەسی متمانە پێکراو ( ثقة )شدا .
ب.وەمەبەست لەوگوتەيەيان ( هذا حديث غير صحيح ) ئەوەيە کە ئەو پێنج مەرجەی کەڕابورد هەموويان يان هەندێکيان تيايدا نەهاتۆتەدی نەك

ئەوەی کە خودی شتەکە ( نفس الامر )ەکە، درۆبێت لەبەر دروست بونی پێکان ( الاصابة ) لەکەسێکدا کە هەرچەندە هەڵەشی زۆر بێت .

٧.ئایا لە ڕشتە ( اسناد ) دا . پێداگیری ( جزم )دەکرێت بەشێوەیەکی گشتی ( مطلق )کە ئەو سەنەدە . لەدروستترینی سەنەدەکان ( اصح الاسانید )ە :

ڕای هەڵبژێردراو ( المختار )ئەوەیەکە پێداگیری تەواو ناکرێ ، لەسەنەددا بەوەی کە بەشێوەیەکی گشتی دروست ترینی سەنەدەکانە . چونکە جیاوازی پلەکانی صەحیح بوون . بنیادنراوە لەسەر بۆ گونجانی ( سند )ەکە لەهاتنەدی مەرجەکانی صەحیح بوندا ، وە هاتنەدی بەرزترینی پلەکان ( الدرجات )لەسەرجەم مەرجەکانی صەحیح بووندا زۆر دەگمەنە جا باشتر وایە لەمەدا کەدەست هەڵبڕین لەحوکمدان بەسەر ( سَنَدْ )دا ، بەوەی کە ( مطلقاً )صەحیح ترینی سەنەدەکانە لەگەڵ ئەمەشدا گوتەی هەندێ لەپێشەوایان نەقڵ کراوە . کەقسەیان لەسەر صەحیح ترینی سەنەدەکان کردووە وە بەڕوکەشی ( ظاهر ) وادیارە کەهەر پێشەوا ( الامام )ێك ، ئەوەی پەسەند کردووە کەلەلای خۆی بەهێز بووە، لەو گوتانە ئەوەیە کە صەحیح ترین ئەمانەن :

أ.( الزهری عن سالم عن أبیه ).

کەئەمەش لە ( أسحاق بن راهویه ) و ( احمد )ەوە ڕیوایەت کراوە .

ب.( ابن سیرین عن عبیدة عن علي )

کە ئەم ڕایەش لە ( ابن المدینی ) و ( فلاس )ەوە، ڕیوایەت کراوە .

جـ.( الأعمش عن ابراهيم عن علقمة عن عبدالله ) كەئەم ڕايەش لـە ( ابن معين )ەوە، وەرگيراوە .

د.( الزهرى عن علي بن الحسين عن ابيه عن علي ) :كەئەم ڕايەش لە ( ابي بكر بن ابي شيبة )ەوە، ڕيوايەت كراوە .

هـ.( مالك عن نافع عن ابن عمر ) :كەئەم رايەش لـە ( الأمام البخارىَ )يەوە، ڕيوايەت كراوە

٨.يەكەم كتێبى ( مصنف ) لە صەحيحى ڕووت ( مجرد )دا كامەيە ؟

يەكەم دانراوێ لە صەحيحى ڕووت ( مجرد )دا كتێبى ( صحيح البخارى )يە پاشان (صحيح مسلم) وەئەم دوانە صەحيح ترينى كتێبن لـەدواى قورئانى پيرۆز ، وە هەموو ئوممەت كۆكن لـەسەر ئەوەى كە ئەوكتێبانەيان وەرگرن .

أ)كاميان صەحيح ترە:بوخارى صەحيح ترە وەسودمەند تريانە چونكە فەرمودەكانى بوخارى پەيوەستى ( اتصال )يان زياترە و پياوەكان ( رجال )ەكانى خاوەن متمانە ترن وەهەروەها هەڵهێنجراو ( استنباط )ى فيقهى تيادايە و چەند خاڵێ( نُكَتْ )ێكى حوكمى تيادايە كەلـەصەحيحى موسليم دا نيە جا بەم جۆرە كتێبى ( صحيح البخارى )صەحيح ترە لـەكتێبىصەحيحى موسليم،ئەمە بەشێوەيەكى گشتى دەنا،هەندێ فەرموودە لە ( مسلم )دا هەيە كە بەهێزترن لـەهەندێ لـەفەرمودەكانى بوخارى وەك گوتراويشە كە ( صحيح مسلم )ئەصەح ترە بەلاًم گوتەى يەكەم تەواوترو ڕاسترە.

ب)ئایا ئەو دووکتێبە سەرجەم فەرمودەی صەحیحیان لەخۆگرتووە " یان پابەندبوون پێوەی؟

( بخاری ) و ( مسلم )لەو دووکتێبە صەحیحەیاندا سەرجەم فەرموودەی صەحیحیان نەگرتۆتە خۆ ، و پێوەشی پابەند نەبورن ( الأمام البخاری )فەرمویەتی(ما أدخلت في كتابى الجامع الا ماصح وتركت من الصحاح لحال الطول) .

واتە : لەم کتێبەمدا جگە لەصەحیح هیچی ترم تێکەڵ نەکردووە وەلە فەرمودەی صەحیحی تریشم تەرك کردووە، لەبەرئەوەی درێژنەبێتەوە .وە ( امام المسلم )دەفەرموێت : ( ليس كل شئ عندي صحيح وضعته ههنا أنما وضعت ما أجمعوا عليه) واتە : من مەرج نىيە هەموو شتىٚ لەلام صەحیح بوبىٚ ،لێرەدا دام نابىٚ ، بەڵكو من ئەوانەم داناوە کە کۆڕایی ( اجماع )یان لەسەرکراوە .

جـ.ئایا زۆر یان کەمیان لەفەرمودەی صەحیح لىٚ بەجێماوە ؟

١.( حافظ ابن الأخرم ) دەڵێت :شتێکی زۆرکەمیان لىٚ بەجێماوە وەلەبەرئەمەش ئینکاری لەگەڵ کراوە .

٢.گوتەی صەحیح لەسەر ئەوەیە زۆریان لىٚ بەجێماوە لە ( الامام البخاری )یەوە، نەقڵ کراوە ، کە گوتویەتی : (وما تركت من الصحاح أكثر ) وەفەرمویەتی ( أحفظ مائة الف حديث صحيح و مائتى الف حديث غير صحيح) واتە صەد هەزار فەرمودەی صەحیحم لەبەرەو دووسەد هەزار فەرمودەی لاواز ( غير صحيح )م لەبەرە .

د.ژمارەی فەرمودەی هەریەکەیان چەندە ؟

١.بوخاری گشتییەکەی ( ٧٢٧٥ )فەرمودەیە بەدووبارەبونەوەکان و بەبیّ دووبارە ( ٤٠٠٠ )فەرمودەیە .

٢.موسلیم : بەگشتی ( ١٢٠٠٠ )فەرمودەیە . بەدووبارەبونەوەو بیّ دووبارەبوونەوە نزیکەی ( ٤٠٠٠ )فەرمودەیە .

هـ.ئەو فەرمودانەی کە ( بخاری ) و ( مسلم )بەجێیان هێشتووە ئیتر ئەوانی تر لەو فەرمودە صەحیحانە لە کوێن ؟

لە کتێبە باوەڕپێکراو ( معتمد ) ناسراوەکانی وەك ( صحیح ابن خزیمة ) و ( صحیح ابن حبان )و ( مستدرك الحاکم )و چوار ( سنن )ەکە، ( نسائی ) ( ابو داود)،( ترمذی ) ( ابن ماجة ) و ( سنن الدار قطنی ) و ( البیهقی )و هتد... دا هەن .

وەتەنها ئەوە بەس نییە کە فەرمودە لەو کتێبانەدا بێت ئیتر صەحیح بێت بەڵکو پێویستە دەق هەبێت ( التنصیص ) لەسەر صەحیح بونەکەی تەنها لەکتێبێکدا نەبێت . کەبەمەرجی دانابێت کە تەنها فەرموودەی صەحیح بهێنێت ، وەك کتێبی ( صحیح ابن خزیمة ) .

١.قسەکردن لەسەر کتێبەکانی ( مستدرك الحاکم ) و ( صحیح ابن خزیمة ) و ( صحیح ابن حبان ) :

أ.( مستدرك الحاکم ): یەکێکە لەکتێبە گەورەکانی فەرمودە، دانەرەکەی تیایدا ئەو فەرمودە صەحیحانەی باس کردووە کەلەسەر مەرج ( شرط )ی هەردو پیری پێشەوا( بوخاری و موسلیم )ن ، ( شرط الشیخین )یان

لەسەر مەرجی یەکێکیانە و نەیان هێناون لە کتێبەکانی خۆیاندا هەروەك ئەو فەرمودە صەحیحانەشیان باس کردووە کەلەلای خۆی صەحیحن و هەرچەندە لەسەر مەرجی هیچ کامیشیان نەبێت بەشێوەی ئەوەی کە ئەوفەرمودانە سەنەدەکەیان صەحیحە تەعبیری لێ داون وەهەندێ جار هەندێ فەرمودەی باس کردووە کە صەحیح نین . بەلاّم ئاگاداری لەسەر داون وەکەسێکی ئاسانکار ( متساهل )بووە لە بەصەحیح دانانیفەرمودەدا بۆیە پێویستە کە بەدواداچوون بکرێ لەسەریان وبە و شێوازەی کە شایانی خۆیانە حوکمیان لەسەر بدرێ . وە ( امام الذهبي ) بە دوا داچوونی لە سەرکردوون ، وحوکمی لە سەر زۆریان داوە، بەو شێوازەی کە بۆیان گونجاوە . وە تا ئێستاش ئەو کتێبە پێویستی بە بە دوا داچوون ( التتبع )وبایەخ پێدان .( العناية) هەیە .

ب.( صحيح ابن حبان ) : ئەم کتێبە ڕێکخستنێکی داهێزاو (مخترع ) ی هەیە ، بە گوێرەی ( ابواب ) و (مسانيد ) ڕێك نەخراوە . هەر بۆیەش ناوی ناوە ( التقاسيم و الانواع ) وە دەرخستن و دۆزینەوەی فەرموودە لە کتێبەکەیدا ، زۆر سەختە ، وە هەندێ لە دواینەکان ( المتاخرين ) ڕێکیان خستووە بە سەر (ابواب ) – باب باب – کردنیدا ، وە دانەرەکەشی زۆر ئاسانکارە لە حوکم دان بە سەر صەحیح بوونی فەرموودەدا،بەلاّم ئاسانکارییەکەی لە ئاسانکاری (حاکم ) کەمترە.

ج.( صحيح ابن خزيمة ) :ئەم کتێبە پلەکەی بەرزترە لە ( صحيح أبن حبان ) چونکە بە توندو تۆڵتربەدوادا گەڕانی بۆ فەرموودەکان کردووە ،

